بسم الله الرحمن الرحيم

# کانیاوی غەزەل

مستەفا پۆڵادەرک

«رامیار»

کانیاوی غەزەل

مستەفا پۆڵادەرک «رامیار»

پیتچن: محەمەد ئەمین شاسەنەم: ۰۹۱٤۱۸۰۵۵۹۷
عەلی جەوشەنی: ٦٢٤٢٩٢١

وێنەی رووبەرگ: ئەحمەد غوڵامی

ئەژمار: ۱۰۰۰ دانە

بڵاوکەرەوە: ئینتشاراتی هیوا «تاران»

شابک:

مستەفا پۆڵادەرک «رامیار»
ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی لە ئاوایی شێخاڵی سەربە بۆکان لەدایک بووە.

---

سڵاو و ڕێزی تایبەتم هەیە بۆ شاعیر و وەرگێڕی بەتوانای لاوی بۆکانی کاک ئەمین گەردیگلانی کە بۆ پێداچوونەوەی ئەم بەشە لە شێعرەکانم هەوڵێکی زۆری داوە و زەحمەتێکی فرەی کێشاوە.
پڕ بە دڵ سپاسی دەکەم.

پێشکەش بە:

ڕۆحی پاکی بابم

«ئەبووبەکری عەلی سابڵاغی»

کە دنیای ڕوونی ئەوینی پێناساندم



«ئەبووبەکری عەلی سابڵاغی»

خۆشەویستی گشت جوان و پیر بووی
ڕووخۆش بووی دڵتەڕ، کوا ئەتۆ پیر بووی
کاتێ دێوەزمەی مەرگ هاتە پێشت
چۆن بوو بابەگیان وا زوو دەسگیر بووی؟!

# کانیاوی غەزەل و مرۆڤەکانی گوندەکەی من

ناسری حیسامی

«کاتێک پەردەی ژوورەکەم دادەدرێتەوە، لە بیرم دەچێتەوە من لێرەم. لەبیرم دەچێتەوە ئەوانەی بە شەقامی بەر پەنجەرەکەدا رادەبوورن، هەموویان نەناسیاون. لەبیرم دەچێتەوە دورگەیەکم تەریک و چۆڵ، لە ناوەڕاستی ئۆقیانووسێکی نامۆییدا.

سووک سووک، وەک قۆزاخە لۆکە بە دەم باوە، دەڕۆم. دەگەڕێم بە سەر ئەو جێگایانەدا کە بیریان دەکەم. دەدوێم، لەگەڵ ئەوانەی خۆشم دەوێن و لێیان دوورم. لە یادمدا، ئەو گوندەی لێی گەورە بووم، لە داوێنی چیاکە، لەبەر مانگەشەوێکی ڕووناک، لەشی هیلاکی خۆی، بە خەو سپاردوە.

مروڤ کاتێک بە خەیاڵ دەگەڕێتەوە بۆ ڕابوردوو، هەرگیز ناتوانێ ئەوە ببینێ کە شتەکان، لە گەڵ تێپەڕبوونی زەمان گۆڕاون. ئەو منداڵانەی پێکەوە ئێواران چاوشارکێمان دەکرد، ئێستا ژن و پیاوی پیرن. کە قسەیان لەگەڵ بکەی، باسی ئەوە ناکەن لە سەر لقی کام دار، هێلانە کۆترێک هەیە کە بچین هێلکەکانی دەربێنین.

ئێستا هەرکامەیان بە قەد چەندهەواڵنێر، هەواڵی پێیە لە بابەت سووتمان و، بۆمباران و، وشکەساڵی و... ئەوینی ناکام و هەزار حیکایەتی تاڵ و مزر. ئەو نەمامانەی ئەوکات پێمان لێ دەنان، ئێستا هەرکامەیان دارێکن سێبەر لە خانوویەک دەکەن، ئەگەر وشک نەبووبن و، ئەگەر نەبڕابنەوە.

بەڵام لە خەیاڵی مندا، منداڵەکان هێشتا بە دەنگی ئەوکاتیان دەزریکێنن و، نەمامەکان هەروا شلکن. خۆشم بێخەیاڵ و بزۆز، لە هاتوچۆدام و...»

ئەو چەند دێڕەی سەرەوەم، نزیکەی ساڵێک لەوە پێش نووسیبوو. گەلێک جار، ئەو گوندەی لێی گەورە بووم، بە ماڵەکانییەوە، بە مرۆڤەکانییەوە، بە کانییەکانییەوە و بە بۆن وبەرامەی خاکەکەیەوە، لە یادمدا زیندوو دەبێتەوە.

گوندێک، لەبەر سێبەری چیای «ئاڵمەڵوو» و لە لە ساوپەنای نزرگەی «سوڵتان»دا. گوندێک، کە کانییەک و چەند دیواری نیوەڕووخاو دەکەوێتە نێوان «گەڕەکی سەرێ» و «گەڕەکی خوارێ»ی. گوندێک کە ژنەکانی و کچەکانی بۆ ئاوهێنان دەچنە «کانیی حەمەسنە» و، پیاوەکانی ئێستاش بە تەمان «کانییەسوێر» ڕۆژێک لە

ڕۆژان بکەوێتە بەر بەزەیی خوا و، پڕ بە پلووسکەکەی ئاوی پێدا بێ. کانییە سوێر، چۆڕێک ئاو و هەندێک قەوزە لە پەنای کەندەڵانێکی ئەشکەوت ئاسای لە خیز و خڕکەبەرد، لە گەڕەکی خواریێ، لە قووڵکەیەکدا هەڵکەوتووە، لەداوێنی ئەو ڕێگایەی ماڵەکان لە مەزرا جیا دەکاتەوە.

ئەو شاعیرەی ئێستا کتێبەکەی بەدەستتانەوەیە، خەڵکی ئەو گوندەیە. دانیشتووی خانوویەک لە خانووەکانی گەڕەکی خواریێ، لە پشتی کانییە سوێر، لە نێو ڕیزەماڵێکی دیکە، کە پڕن لە منداڵ و، ژن و پیاو و، لە ژاوەژاوی ژیان و، لە خەون و لە هیوا و، لە ژان و حەسرەت و، ورینگەی گۆرانی و، گەرای شیعرو، لێواولێوی زەردەخەنە و، بوغز و فرمێسک.

ئەو کوڕەی ئەو شیعرانەی نووسیوە، لە شێخاڵی گەورە بووە. لە گوندەکەی من. لەو جێگایەی کچەکانی جاری وایە بە دەم ڕێوە گۆرانی دەڵێن و، کوڕەکانی جاری وایە بەدەم دروێنە و جۆماڵ و خشتبڕینەوە شیعر دەڵێن:

وەک بەردێ لە گۆما کە لەبەرچاوێ دەبێ ون
چی لێ دێ لە ناو چۆمی ژیان مەڕمەڕی لاوی؟
هەر بۆنی خەم و تۆزی تەم و نالەیی لێ دێ
هێلانە بکا شیعرێ، پەپووی خەم لە هەناوی
وەک کەکرەیە ئەو ژینە لەسەر زاری ئەم و ئەو
سا دڵ بڵێ پێم چۆن لەگەڵ ئەو تاڵییە ماوی؟

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە، ژیانی ئەو مرۆڤانە، زۆرانبازییەکی بەردەوامە لە گەڵ مەینەت و ئازار و دژواری، تەنیا بۆ زیندوومانەوە. لەو زۆرانبازییەدا، تۆ وەها سەرقاڵی خۆڕاگرتن دەبی، کە تا ئاوڕ دەدەیەوە لاوەتیت تێپەڕ بووە و، بەفری مووی سپی سەرانسوێکانی روخسارتی داگرتووە.

لە شێخاڵی، ئەوکاتی ئێمە منداڵ بووین، جاری وابوو لە سەر تاقەدارەکەی قەبرانی سەرێوە دەنگی کوندەبەبوویەک دەهات. لەوکاتانەدا ترس و غایەڵە و بەدگومانی، سەراتاپای خەڵکی ئاوایی دادەگرت و، دوایی کە دیوارێک دادەڕووخا بە ئەنجامی ئاوازی ئەو باڵندە تەنیایەیان دەزانی.

شیعرەکانی ئەو چەند لاپەڕەیە پڕن لە مەفهوومی تاڵی و دژواری و هیلاکی و ژان. کەکرە و تۆز و غوبار و، دڕوو و برین و تینوێتی و قرچەی گەرما و....

بەڵام بە هەموو ئەوانەشەوە، ژیان، ڕەنگەکانی خۆی لێ ون نابێ. ژیان لەو گوندە بچووکە بێدەنگەش، تام وبۆنی خۆی هەیە. بەیانانی بەهار کە باڵندەکانی دەخوێنن و، ئێوارانی هاوین کە خاکی کێوەکان و تەپۆڵکەکانی لە گەڵ هەموو هەنگاوێک بۆنی جاترە و نەعنەی کێویی لێ هەڵدەستێ. ئێواران کە دەهاتینەوە جل و بەرگمان هەمووی بۆنی خاک و بۆنی گیا بوو.

من کە باسی شوێنی ژیانی شاعیرەکە دەکەم، دەمەوێ بڵێم وشەکانی ئەم کتێبە دەناسمەوە. تۆ ئەگەر نووسەرێک بناسی، کاتێک کتێبەکەی بەدەستەوە دەگری، هەست بە ئاشنایەتییەک لە گەڵ وشەکانی دەکەی. ئەو ماندوویەتییەی لەم شیعرانەدا باسی دەکرێ، مرۆڤ یەکجار زیندووتر هەستی پێدەکا ئەگەر مەزرا قاقڕەکانی ئەو گوندەی دیبێ. مانای ناکامی باشتر هەست پێدەکەی، ئەگەر جارێک گوێت دابێتە قسەی پیرە هەناسەساردەکان و گەنجە دەس بەتاڵەکانی. من، لە کاتی خوێندنەوەی ئەم

کتێبەدا، هەستم دەکرد گـوێم لـە بەسـەرهاتێک گرتـووە. بەسەرهاتی کۆمەڵێک مرۆڤ و کانی و درەخت و باڵـندە، لەوسالانەدا کە لێیان دوور بووم. لەوێ بـەفر دەبـارێ و، دوای ماوەیـــەک دەتوێتـــەوە. نەخۆشـــی دێ و، دوای ماوەیەک تێدەپەڕێ. ڕێبـوار و، دەروێـش و، کـاروانی و دۆم و وردەواڵەفرۆش دێن و لادەدەن و دەحەسێنەوە و دەڕۆن. وەرزەکان تێدەپەڕن و، هەور و باران تێدەپـەڕن و، سالـەکان تێدەپـەڕن و، ئـەوەی تێناپـەڕێ مەینەتـە و هیوایەکی پیری تەمەندرێژ کە جێگایان خـۆش کـردووە و نارۆن.

وەک وتم لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، بـیرم لای بەسـەرهاتەکان بـوو. کـەمتر بـیرم هاتـەوە پێوانـەکانی شیعر، دیمەن و تەعبیر وکێش و سەروا، بێنمە بەرکار. تۆ جـاری وایـە دەچیتـە لای میوەفرۆشـێک و، بـە سـەنگ و تـەرازوو میـوەت پـێ دەفرۆشـن. چـاو لـە میـزانی تەرازووەکـە دەبـڕی بـۆ ئـەوەی بـزانی سـەروخواری چەندە. بەڵام جاری وایە دەچیتە ناو باغێک و ، هینـدە بـە تامـەزرۆیی کۆشـت دەگریـەوە و باغەڵـت پـڕ دەکـەی، تەرازووت لە بیردەچێتەوە.

# کانیاوی غەزەل

ڕازی خۆت هێندە لە دەس نامەحرەم و دووڕوو مەنێ[1]
کەس ئەوەندەی تۆ بە ڕووی ئاوێنەوە پێناکەنێ
گەنجی من بۆ زێڕوەشانی زولفەکەت باشە بەڵام
بەژنی تۆ هێند بەرزە واژەی من گەلێ جار نایگەنێ
گەر گوڵی باخان هەموو بێن خۆ موقابیل کەن بە تۆ
من دەزانم بۆ جوانی گیانە هیچی ناتگەنێ

---

[1] - دوو بەیتی سەرەتای ئەو شێعرە لە مامۆستا «هێدی» وەرگیراوە

تۆ ڕەزاسووکی و کەزیٚ شۆڕ، کوڵمە ئاڵ و چاو بەڵەک
شۆخی وەک تۆی کەس نەدیوە پیٚ لە سەر ئەو خاکە نیٚ
وا پەری شیٚعرم لە دەوری بەژن و باڵات دیٚ و دەچیٚ
دەستی ناگاتە قەدت، دەیداتە گریە و شیوەنیٚ
خاڵی سەر لیٚوت بە قوربان من دەڵیٚم پیرۆزەیە
شیٚتە هەرکەس لە موقابیل زیٚڕ و گەنجی دانەنیٚ
بولبولی دڵ بۆ گوڵی ڕووت کار و پیشەی زارییە
هەڵوەدایە چۆتە چۆڵ و کیٚو و دۆڵ و بەندەنیٚ
گیانەکەم بیٚ ئاوی لیٚوت وشکە «کانیاوی غەزەل»
گەر هەموو دەم بیٚن لە ئاوی کەوسەریٚ ئاوی دەنیٚ
من بە دڵ وەسفی گراوی خۆم دەکەم ئیٚستا، کەچی
غەیری تیر و تانە خەڵکی ئافەرینم ناکەنیٚ
سەیرە من پیٚم بۆچی لۆمەی من دەکەن پیر و جوان
کیٚ هەیە ئەمرۆ لە ژینا گیرۆدەی ئەم دەردە نیٚ
باسی جوانیت گەر دەکەم من هەر خەیاڵە، خۆ دەنا
زۆر لە دیوان تیٚپەڕیوە کاری شیٚعری سادە نیٚ

تۆ بڵێ تا کەی ئەسیری داوی بەندی کەزیەکەت
شەو لە خەودا هەر بە یادی جوانی ڕووی تۆ ڕاچەنێ؟
من کە داوای ماچی لێوی تۆ دەکەم دڵمەند مەبە
نازەنین تاوانی من نێ توفلی دڵ ڕووم لێدەنێ
دڵنیام گیانە بە وێنەی کۆکەنی شیرین گراو
ڕۆژێ دێ «ڕامیار» کە وێنەی تۆ لە بەردی هەڵکەنێ

پاییزی 80ی هەتاوی

# هەڵوەدایی

له دووری بەژن و باڵات چاو کەژاڵم
پەرێشانە وەکوو زولفت خەیاڵم
مەلێکم وا لە داوی بسکی تۆدا
پەشێو و دیل، گرفتارم، دەناڵم
وەکوو پەروانەیی دەوری شەمی کز
بە گڕدا چون هەموو سووتاوە باڵم

دڵت بردم بە غەمزەی چاوی مەستت
نە دینم ما، نە هۆش و بیر و ماڵم
فریوت دام بە ماچی لێوی ئاڵت
منی شەیدا کە هێند ئاشق جەماڵم
لە کوێستانی سپیی سینگت، گوڵی من!
ڕوانیم، دیمەوە جووتەی تەماڵم
وەکوو مەجنوونی وێڵی کێو و هەردان
شەکەت، ماندوو، هیلاک و بێ هەڤاڵم
نییە ئۆقرەم بە شەو ساتێ هەتا ڕۆژ
لە داخ بێ باکیی و سەففاکی زاڵم
بەڵێ «ڕامیار» لە پێناو دیدەمەست بوو
سەراپا هەڵوەدایی و ژینی تاڵم

1380/9/26

# کۆترە باریکە

خەڵکی پێیان وایە ئاشق شێت و هەرزە و لێوەیە
بێخەم و مەسروور و شاد و مەست و بێهۆش، بێوەیە
دەردەدارە، بێ پەرەستار، زامی قەلبی دایما
خوێنی لێ دێ، دەرد و ژانی بێ ژماری پێوەیە
مانگی بەفرانبار ئەگەر یارم لە لابا لەحزەیەک
وام ئەزانی گەر بەهارە مانگی خاکەلێوەیە

حاکمی سینە و مەمێتی حارسی پاوانەکەی
دانە خاڵی بەرز و تەرزی وا بە بەر گەردنێوەیە
دوور نییە زستان و بەفریش یاری یەک بن چون دەڵێن
مەوسیمی زستانە ئاشقی بەفری گەرد و کڕێوەیە
خەمڕەوێنە بۆتە وێنە، من دەڵێم هاوتای نییە
کاتێ تەسویری بزەی دێ شاگوڵی ئەو لێوەیە
هەرکەسێ شەیدایە چۆتە لێڕەوار و بەندەنێ
بۆ مەڕامی دڵ نەبێ بۆ هەڵوەدای ئەو کێوەیە؟!
خەم لە نێو کوانووی دڵمدا ئاگری کردۆتەوە
تا دەمی مردن چلۆن من دەربەرم بەو شێوەیە
چاوەڕێی چی شەو هەتا ڕۆژ؟ «ڕامیار» تو پێم بڵێ
« فاخیتە»ی هیوات لە کوێ بوو دێتەوە بەرێوەیە[١]

1380/1/21 ـ تەورێز

---

١ - ئەم شێعرە لە سروەی ژمارە208 دا بڵاو بۆتەوە

# ئەوين

پێشکەش بە گۆواری سروە

فیدای جیلوەی جەماڵت بم کە دەنوێنیٚ بە سەد وێنە
هەتا کەنگیٚ بە مەوهوومی؟ وەرە تاوێکی بمدوێنە
بە عشیوە و نازی پڕ ڕازت بەسم ئازار بدە ئازیز
دڵم ئاوێنەیی ڕووتە، وەفات بیٚ، هێندی مەشکێنە
لە داوی بسکی خاوتدا مەلی هیوا گرفتارە
بەزێکت بیٚ بە دیلی ڕووت، گوڵم ئەو داوە بپسێنە

مەگەر سووچم چ بوو تۆ وا وەبەر تیری مژۆڵت دام
دڵی شەیدای لە غەم کەیلم کەوا نوقمی تکەی خوێنە
پەیامی من بە گوێی «سروە»ی بەیان ناگا هەتا کوتبام
خەفەتباری عەزیزانم هەواڵێکم لەبۆ بێنە
شەمی شەوگاری تەنیایی چرای ڕووناکی ماڵم سا
دڵم پەروانەیی ڕووتە پەڕ و باڵی مەسووتێنە
وەرە «سروە» کە وەک شەوبۆی ئەتۆ، دێ بۆنی زولفانت
لە ناو شاری دڵی کۆمەڵ دەمێ لەو عەترە بڕژێنە
بڵێ «هێدی» کە تۆ یاری «هەژار» و «هێمن»ی کورد بووی
بە یادی وان وەکوو بولبول لە ئەو مەڵبەندە بخوێنە
دەزانم ئاشق و شەیدای گوڵ و باخی موکریانی
دڵت پڕ مەینەت و داخە مەکۆی سەد ڕازی بەنهێنە
هەزار خۆزگە ئەمن دیبام ئەوین و پێم بگوتبایە
ئەوەی هەست و کوڵ و سۆزە ئەتۆ لایان بدرکێنە
لە مەیدانی قەڵەم ئێستاش کە تۆمان هەی شوکور «قازی»
زەوی و مەزرای دڵی خوێنەر بە بەستەی تازە داچێنە
ئەوینداری گوڵە «ڕامیار» بەڵێ ڕێبواری ڕێی عیشقە
ئەگەرچی وا لە کۆمەڵ دوور، دەمێکە بێسەروشوێنە

13801016 هەتاوی

# سلاوی یار

وەکوو ئیلهامێ بوو یار ئەو سلاوە
دڵی ماندووم بە بێشک پێی حەساوە
بە تیرێژی نیگای گەرمی ئەوینت
سەهۆڵ و بەفری ناکامیم تواوە
لە کوێ دەتزانی باخی زەردی هیوام
بە بێ ئاوی دەمت ویشک و بێ ئاوە

زنەی مێرگی هومێدم بوو بە مەیلت
لە ئاو کەیل و نوقم بوو، وا ژیاوە
کە رۆح باوێمە بەر پێی ئەو ئەوینە
لە کیس ناچێ، لە بۆ تۆ هەر شیاوە
بە ئاواتم گەییم، ئۆخەی ئەمن بووم
لە سایەی سێبەری باڵی هوماوە
گوڵم دێم و لە حەوشەی عیشقی تۆدا
دەکەم شادی بە دەم بەزم و سەماوە
گوتم چێ نازەنینم خاڵی لێوت ؟!
هەزار سوقرات و لوقمان لێی دواوە
گوتی «ڕامیار» ئەوە گەنجێکە بێ بن
دەبینی جوان و تەرز و بەرزە ناوە

نەورۆزی 81 هەتاوی

# پۆلانە

پێشکەش بە هەڵەبجە

بەم ژینە شادبوون ئەمڕۆ بێ هۆیە
چونکە دڵ نوقمی تەم و بۆسۆیە
هاودەمی ژینە خەم تاکوو دەمرین
هەر بووکی شادی لێمان نامۆیە
گەل دەڵێی قووتی ژینی نەیارە
ڕەقیب بۆ خوێنی هێند تامەزرۆیە

دایکی نیشتمان لە تاوی کۆرپەی
دڵ کەیل و حەزین دەستەو ئەژنۆیە
لە دەوری تەرمی هەڵەبجەی شەهید
وایلۆک و زاری، شین و ڕۆڕۆیە
بۆ تیشکی هیوا و هومێدی کۆمەڵ
چاوی ئاواتم هەر لە «ئاسۆیە»
بەو ژینە هەرگیز مەنازە «ڕامیار»
لەش کە «پویلانە»ی ماڵی گڵگۆیە

هەتاوی 1381
تەورێز

# خەزنە

دڵ لە داخی مەینەت و ژان ڕوو لە پێک و مەی دەکا
بۆ خەفەتتارێن نەبێ، دڵ بیری مەستی کەی دەکا؟
ئەو کەسەی شەیدای ئەوینە و خادیمی ڕێبازەکەی
هەرچی دەیبینێ بە تەوس و تانە سەر کۆنەی دەکا
دڵ کە مەحزوونی نیگار و ئاو و خاک و زێدییە
شەو هەتا ڕۆژێ دەناڵێ شینی سەد هانەی دەکا

خاڵ و بسک و بەژن و هەنیە بوونە مایەی شێعری تەڕ
گەرچی شاعیری ئەویندار گشت مرۆڤ لۆمەی دەکا
مەستە بۆ هەستە خەیاڵ گەر ڕوو دەکاتە خاڵەکەی
ئارەزووی مەهنی نیگار و ماچی سەر گۆنەی دەکا
پیر بووە سۆفی دەزانێ کیژی جوان لێی سڵ دەکەن
کوا دەنا تا جوانێ مابێ ئەو بە دڵ تۆبەی دەکا
قووڵە زێی ئاوات و خۆزگەی ئاشق و سەوداسەران
ژیر و چازانە ئەوەی گەر ڕوو لە ئەو گۆمەی دەگا
مەحرەمە ئەو خاڵە «ڕامیار» بۆتە «خەزنە»ی گەردنی یار
حارسی سینگ و بەرۆک و باغی ساوای بەی دەکا

1381/6/5 هەتاوی

# تەوژمی ژین

دەروونم پڕ لە ناسۆرە بە زەختی زەربەتی ژین
دەناڵێنم لە بۆ هەتوان لە گۆشەی غوربەتی ژین
کە دڵ وا بۆتە هەنبانەی پەژارە و ئاخ و دەردان
دەبەم هانا لە بۆ مردن لە داخی مەینەتی ژین
خدر گەر شێت و شەیدا بوو لە بۆ ئاوی حەیاتێ
شەرابم بێ، قەتم ناوێ دڵۆپێ شەربەتی ژین

نییە ئۆقرەم لە تاوی لەیل، منی مەجنوونی خولیا
شەو و ڕۆژ وێڵ و عەودالّم لە دەشتی حەسرەتی ژین
سنووری نیّ ئەوین ، دەرزی ژیانە گەرچی ئەمڕۆ
سەری بەرزی بە زۆر داوێنە ژێر دار و پەتی ژین
لە بۆ رێبواری رێی هیوا ئەگەرچی زۆرە لەمپەر
بەڵام هیچی بەژان نین وەک برینی فیرقەتی ژین!
تەمەن هەر پێنج و دوو ڕۆژە، بەڵام جانتای خەیالّم
لە واژەی ماتەما کەیلە کە بوونە سەروەتی ژین
بزانە داد و گازندەی لە دەستی تۆیە «ڕامیار»
دەبیّ سووچی چ بیّ تۆ وا ئەوەن بیّ مروەتی، ژین!؟

لە گۆواری مەهاباد ژمارە29 بڵاو کرایەوە

# وشەم ون بوو

وشەم ون بوو نیهانی من نەدرکا
تەمەن ڕۆیی، دڵم هەر دانەمرکا
کە ڕازێکی گرانم پێیە ئەی یار
بە تۆی بێژم دەگەڵ دوا نرکەنرکا
مەلی ئاواتی من چۆن باڵ بدا لێک
لە دەس باشووی پەژارە و ژان و برکا

سەعاتی عومرم ئەڕوا هێند بە توندی
دەلەرزێ دڵ لە ژێر بای چرکەچرکا
دەڵێی خەم عومری نووحی پێدراوە
لە سینەمدا بڵێی تاکەی عومر کا
شەماڵی وەرزی غەدری خەم نەبایە
گوڵووکی تاسە ڕەنگی دەبزرکا
دەڵێم دڵ زۆر پەرێشانە، دەنا بۆ
دەبوو هێند ئارەزووی ماڵی قەبر کا
وتەی «ئەحمەد» هەوە «ڕامیار» کە ئێژێ[1]
وشەم ون بوو نیهانی من نەدرکا

ئەو شێعرە لە گۆڤاری هەوار ژومارە 3و2دا
بڵاو بۆتەوە لە گۆواری مەهابادی ژمارە35
یش دا بڵاو بۆتەوە

[1] - دوو بەیتی سەرەتا لە کاک ئەحمەد تاقانە وەرگیراوە

# زوڵاڵی ئەشق

هومێد سەوزە و تەبیعەت کوا جل و بەرگی سروور بەر کا
لە ژێر تاڤگەی «زوڵاڵی ئەشق» دەر و دەشت پاکی ئەخزەر کا
بە سەد مەهن و نزاکەت گوڵ لە بۆ ژوانێکی گەڵ بولبول
لە ناو باغچەی حەز و خۆزیا چرۆی عەهد و وەفا دەرکا
دەیان کۆتری تەبع دەگرێ بە داوی بسکی خاوی، گەر
لەسەر کوڵمی سپیلکەی یار بەناز تای زولفی چەمبەر کا

گڕی مرخی ئەشق سینەی لە من کردۆتە کوانوو، بۆ
کەسێ نێ بێ دەمێ سەیری دەروونی چەشنی مەجمەر کا؟!
ئەوەندە کۆسپ و لەمپەر هەن لە سەر ڕێی لوتکەیی هیوا
لە ڕێی دژواری عیشقا زۆر مەحاڵە کەس سەرەندەر کا
لە سەنبولی جوانی و شۆخ بە تۆ ناگا، گوڵم سوورگوڵ
لە مەیدانی گرەو گەر ڕووی لە ڕووتا بێنێ هەمبەر کا
دەبێ ساقی خەیاڵم چۆن مەزەی لێوانی تۆی چێژتبێ
کەوا ئاوی دەمت هاوتای گوڵاو و ئاوی کەوسەر کا
لە بۆ وەسفی قەد و باڵات نییە توانای قسەی «ڕامیار»
مەگەر ئاوا لە عیشقت ڕوو لە پێنووس و لە دەفتەر کا

1382/1/2 هەتاوی

تەورێز

## جوانی

پێشکەش بە ڕۆحی پاکی سوارەی نەمر

چاو ئەگەر جوانی نەبینێ ویشکە چاوەی کانییە
ئاو و ڕەنگی ڕووی کچی جوان سەنعەتی یەزدانییە
چاوە بێ ئاو چۆنە، چاو بێ دیمەنی دڵبەر وەها
دوورە نوور و سوور و بێسۆ و سەفا، ویشکانییە
هەر وەکوو قەوس و قەزەح ڕەنگینە بەژنی شۆخی دڵ
یا کەوانی کەسک و سووری شینی دوای بارانییە

خۆشەویستی بێ سنووره لەم ژیان و چاخەدا
هەر چەنێ کەس وەک ئەویندار بێکەس و ریسوا نییە
بۆ لە ژێر پللار و تانەی کۆمەڵن سەوداسەران؟
کام جوان و پیر لە ژینا هەر لە دووی سەودا نییە؟
شێت و ماخولیای گوڵێکم قەت وەکوو مینایە چون
غەیری شۆخ و شەنگ و جوانی خەسڵەتێکی تیا نییە
خۆشە ئەو ریسوایە یاران بۆ منێ شەیدای گوڵم
چون لە بازاڕی عیشق گەنجینە ئەمڕۆ «جوانی»یە
بولبولی تەبعم کە گیری بەندی جوانی و ڕوویەتی
سەیری دڵ کەن چۆن ئەسیری ئاڵقەیی زوڵفانییە
گەر کەوی عیشقم حەزین و ماتەمە بۆ خاڵەکەی
ئاشقی باڵای وەک چیای یا ڕووی وەکوو زۆزانییە
ئە و گوڕووی گرتوویە کۆرپەی دڵ لە بۆ مەمکی ئەوین
ئۆقرە ناگرێ شەو هەتا ڕۆژ یەک دەقیقە و سانییە
من دەڵێم ئاوی حەیاتی کانی ژین پێی زیاد دەبێ
کاتێ تەسویری بزەی دێ ، حاکمی لێوانییە

بیر وەکوو مەجنونی شێواوە پەشێوی لەیلەکەی

دەردی من دەردی ئەوینە ، دەردی سەرگەردانییە

من کە بەو بەرداشی پێنوس وەسفی بەژنی ورد دەکەم

کوا ئەدی ئەو ماچی گۆنای گەر لە جێی ئاوانییە[١]

قامەت و بەژنی گراوم لێ دیار بێ لەحزەیەک

گشتی کۆمەڵ با ببێژن «ڕامیار» وەک شا نییە

ئەو شێعرە لە گوڵچینی
غەزەلی شاعیرانی
کورد (3) بلاو بوتەوە

[١] - ئاوان = کریەی باراش

## زڕەشەو

خەیاڵ ئۆقرەی نەگرت تاوێ لە ئامێزی سڕی شەو
بەرەو لووتکەی حەزێ ڕۆیی، بە رۆحی سووک فڕی شەو
وەکوو کۆرپەی هەتیو پێنووس کە ئەسرینی دەباراند
وتەی دڵ هاتە سەر دەفتەر وەکوو مۆمێ گڕی شەو
چەقی پێی هۆش و بیرگە و حەز لە لیتە و زۆنگی خەمدا
کە هەنگاو چوو بەرەو دەیجوور و زەڵکاو و قوڕی شەو

ئەوەن تامەزرۆی شەوق و گڕی ئەشقە شەوانە
بە ڕووی لێڵ و تەماوی و ڕەش چلۆن نایە قڕی شەو
لە چوار دەوری هەوێزی هەست لەبۆ مێگەل وشەی من
خەفەت مات بۆ پەلامار با وەکوو گورکی دڕی شەو
شەکەت ما ڕێبواری بیر لە بەر باڵی چیای حەز
بە دڵ کەیلی بە دووی ئەشقا ئەوەن ڕێگای بڕی شەو
لە ماڵی دیدە هەڵناکا دەزانم کۆرپەڵەی خەو
دەترسێ بێتە ناو بیرگەی دەیان مۆتەی زڕی شەو
لە جامی لێوی کیژێکی چەلەنگ و شۆخ و شەرمن
بنۆشە پێکی بادەی ئاڵ کە دیتت دڵپڕی شەو

هەتاوی 1382/6/1

# بۆسە

سەر راومی لە سەر هەردی ئەشق گرتووە بە چاوی
بۆیە کز و خەمبار و رەبەن کەوتمە داوی
مەوهوومە لە ناو تەبعی دڵ و دیدەیی بیرگەم
گەرچی وشەیی شێعری تەڕم بۆتە حەزاوی
هەتوانە لە بۆ دەرد و خەمی رۆژی پەژارە
تاوێکی بە دڵ بمژی دەم و لێوی گراوی

بۆ بازی خەیاڵ و مەلی تاسە و کەوی هەستم
دایناوە وەکوو «بۆسە» گوڵم تای قژی خاوی
وەک بەردێ لە گۆما کە لە بەر چاوێ دەبێ ون،
چی لێ دێ لە ناو چۆمی ژیان مەڕمەڕی لاوی؟
هەر بۆنی خەم و تۆزی تەم و ناڵەیی لێ دێ
هێلانە بکا شێعرێ، پەپووی خەم لە هەناوی
وەک کەکرەیە ئەو ژینە لە سەر زاری ئەم و ئەو
سا دڵ بڵێ پێم چۆن لەگەڵ ئەو تاڵییە ماوی؟
تێکێوە دەپێچم بەر و بوخچەی حەز و ئاوات
بۆ ماڵی دڵی پیری دەڕۆم، دەچمە سڵاوی
خەم سووچی چ بوو بەندە کە تۆ وەک کەڵی مەیدان
هاتوویە لە ناو تەبع و دڵ و رازی خزاوی

1383/2/4

# کچی لادێ

گوڵم ئەی شۆخی ریک و پێک و واڵام
وەکوو لاولاو لە بەژنی تۆ دەهاڵام
کە بێ وێنەی لە بۆن خۆشی و جوانی
وەرە بەر ڕێژنە وەسفی تاکی ئاڵام
مریدی خانەقای چاوانی تۆمە
بەڵام تۆ بۆچی گوێ نادەی سکاڵام
بە نێزەی دڵنیایی بێرە ئازیز
جل و بەرگی خەفەت بدڕە لە باڵام

لە مەهابادی ژمارە
20 دا بڵاو بۆتەوە

# بۆ هەڵەبجەی خوێناوی

دەمێکە سروور لێم زیزە دژە
ئاسمانی بەختی ژینیشم مژە
دەمی ناوەتە دەماری هەستم
ئەو زەرۆ  پیسەی ماتە خوێنمژە
مەگەر تاوانی ئێمەی هەژار چیێ
کە ئەستێرەمان هەر کاروان‌کوژە
لە چەمبەرداوی ئازاری هاویێ
خوایە ئەو کەسەی کەوا خوێنڕژە

# کۆچی بێ وادە

بەو وەرزە سەوزە بۆ کوێ ڕۆیشتی
تاسەباری تۆن هۆز و گەل گشتی
چ بوو دێوەزمەی ڕەشی مەرگ لەپڕ
هات تفلّی ساوای دڵی لێ کوشتی
زەرووی دڵڕەقی نەمان دەمی نا
دەماری جەستەت، گشت خوێنی مشتی

ڕێبواری ڕێگای لووتکەی ئاوات بووی
مخابن وێستای پێی نەگەیشتی
ئەسڵەح ماوە سەر « ناسر»! لەو کەسەی
دڵی هات تەرمی ئەتۆی برد ناشتی
«رامیار» بۆ گۆچان دەبێ هانا با
چون بە کۆچی تۆ چەماوە پشتی

ناسر کوڕێکی22 ساڵانە بوو بە هۆی شێرپەنجەی خوێن مرد و خەڵکی زۆریان خەم بوو؛ جیرانی ماڵی ئێمە بوو .

# وەسفی بەهار

ئەوا بەهارە ڕۆژی نەورۆزە
جێژنی پیرۆزی گشت گەل و هۆزە
کێو و دەشت و دۆڵ سەوزە دەنوێنێ
بولبول لە عیشقی گولە دەخوێنێ
هەڵاڵەی زەردە بۆنی دێ لە دوور
چرۆی دەرکردۆ پەلکی گوڵی سوور

بولبول لە عیشق و شەنگی وەنەوشە
بە سۆز دەخوێنێ لە کوڵ و لە جۆشە
لە کوێستانان دێ قاسپە قاسپی کەو
سروشت هەڵدەستێ لە غوڕابی خەو
بەیانان کاتێ ئەنگوت کازیوە
دڵ دەلاوێنێ خوڕە و جریوە
نارەی جۆگەلان دێ لە دەم ڕووبار
بەڵێ ئەمانەن گشت وەسفی بەهار
زۆر خۆشە گەر دێ تریوەی باران
دەگەڵ زریوەی گوڵووکی داران
فیتەی سێروان کاتێ دێتە گوێ
دەدا بە ئێمە موژدەی ساڵی نوێ
بۆ سەیران دەچن بە پۆل کیژ و کوڕ
پێکدێنن گشتی کۆڕی گەرم و گوڕ
سروشت بە بەرگی جوان و ڕازاوە
ئامێز ئاواڵە ڕووی لە هەتاوە

لە سروە189 دا بلاو بۆتەوە

# گۆڕخانەی ئاوات

چ سێحرێکە وا لە کولبەی سینەم
بێ قووت و ژیوەر سانا دەژی خەم
بۆ بەرەنگاری ئەو ئاپۆرەیە
هانا بۆ بادە دەبەم، دژی خەم
###
قورگی ئیحساس و هەست و هەڵبەستم
کەیل و گیراوی غوباری چاخە
منی هەژاری چەواشە و حەیران
لە تاوان پیشەم کێشانی ئاخە

###
گیرۆدەی دەرد و مەینەت و جەورن
خەیاڵ و هۆش و بیر و ئاوەزم
تازە تەسلیمی گۆڕخانەی خەمە
ئاوات، با منیش بڵێم نابەزم

###
بوونەتە قوتی ژینی ئاپۆرەی
مەینەت و کەسەر سەبر و سوباتم
بۆیە دڵ بۆتە دەشتی گۆڕخانەی
هیوا و هومێد و حەز و ئاواتم

###
گەر بە سۆزەی بای ئەوین نەلەرێ
بەژنی نەمامی عیشق و ئازادی
کوا لە ناو باخی ژینی خۆزگەمدا
دەپشکوێ بە دڵ گوڵووکی شادی

###
لە گۆڕەپانی ئەدەبدا تاوێ
دەڵێم بنێم من هەنگاوێکی نوێ
گەرچی نەهاتی بەختی ڕەشم زوو
هێز و بڕستی لەش دەکا شلوێ

###

له هەر چوار وەرزی ساڵی خەیاڵم
خەزانی ڕوو زەرد تێیان خزیوە
بەهاری سەوزی عومرم نەبانە
یا لە دەس پایز دەرچۆ و بەزیوە

###

خەیاڵی فڕین دای لە مەلی دڵ
بۆیە باڵی گرت چۆتە بن هەوران
کەچی ڕاوکەری غەوارەی بەدخوو
کردیە نیشانەی کەوانی دەوران

###

ڕۆنتکی چاوی  وشەی ماتەممە
ئەتکێتە گۆنای کچی هەڵبەستم
کە ڕێژنە واژەی خەفەت بباریٚ
بە سەر دڵا، چۆن بە ژین دڵ بەستم؟

###

سەیرە دەبێ دڵ پێی نەوەستێ وا
ئەسرین کە بۆتە حاکمی چاوان
شەلاڵی ئاوی دیدە نەبا ڕوو
قەت پیر دەبوو وا زوو دڵی لاوان

###

پڕە لە گڵکۆی ناودار و بێ نێو
بێهۆ نیێ دەڵێم گۆڕخانەیە دڵ
کە کەیل و مات و لاواز و گێژە
نوقمی هەزاران ئەفسانەیە دڵ

## چەمەر

پێشکەش بە رۆحی پاکی دوو
برای جوانە مەرگ محەممەد و
ئەبووبەکری عەلی سابڵاغی کە
دەبنە مام و بابم.

بابە گیان ئەوا هاتمە سەر گڵکۆت
جگە لە فرمێسک پێم نیێ دیاری بۆت
تاوانت چ بوو وا بە ناکامی
گەردەلوولی مەرگ هات دای گەمارۆت
#####
خۆشەویستی گشت جوان و پیر بووی
ڕووخۆش بووی، دڵتەڕ، کوا لە کوێ پیر بووی
کاتێ دێوەزمەی مەرگ هاتە پێشت
چۆن بوو بابە گیان وا زوو دەزگیر بووی
#####

گەرمت دەکرد کۆڕ هەر بە پێکەنین
بێزار بووی دایم لە شین و ئەنین
بێ وەفاییت کرد نەتکرد ماڵئاوا
کاتێ بەرەو گۆڕ ئەسپەکەت کرد زین

#####

لە تاوت لێوە و شێت و پەشێوم
تینووی مەیلتم بڕوانە لێوم
چیم دەستەڵاتە سووچی گەردوونە
مەگەر هەموو کات بۆت قوڕ بپێوم

#####

بێ تۆ وەک حافز کوێرە «مستەفا»
سەرت هەڵێنە تاوێ بۆ شفا
بەو شینگێڕییە ویستم یادت کەم
کوتم با نەڵێی بۆ نەیبوو وەفا

#####

بۆ ماڵ و منداڵ زۆرت هەوڵ دا[1]
گەلێ ئاواتت هەبوو لە دڵدا
هات باخی ژینت بێتە بەر «مامە»
گەڵای تەمەنت بۆ وەبن گڵ دا؟!

---

[1] – لەم بەشەڕا هی مامە

####
وێنەکەت بۆتە هەوێنی ئەسرین
چون بە دیتنی خزم و هۆز دەگرین
ئەو کۆچە بۆ تۆ زوو بوو «مامە» گیان
ئەگەرچی ڕۆژێ ئێمە هەر دەمرین

####
هێزت پێی نەشکا بە هێزی مەرگ
بۆیە وا گرتت تۆ ڕێزی مەرگ
زانیت کە دەمری بۆیە پێت وابوو
ئاواڵەیە و گەرم، ئامێزی مەرگ

# بۆ دوا هەناسەی ژین

پێشکەش بە رۆحی هاوڕێم کامیل

من عومری نووحم لە خوا داوا بوو
چون کۆزی تاسەم گەلێ ساوا بوو
مەیخەرە ئەستۆی ئەجەل ئەم سووچە
چونکە خوداوەند، ویستی ئاوا بوو
ڕێبوارێکم بەزیبک و زات و ڕێم خولاسەیە
گەرچی ژینم پڕ لە تاڵی دەرد و ڕەنج و تاسەیە
نامەوێ ناونیشانێ من لە دونیایی بەرین
لێوی وشک و زەردی ڕووم چون خۆی یەکە پێناسەیە

# هاواری دڵ

تەخمیس لە سەر غەزەلی کاک عەلی بوداغی

سەرنووسەری ویژەنامەی «ڕەسەد»

دڵم کەیلە دەناڵێنێ شەو و ڕۆژ هەر دەکا زاری
لە هیجری دڵبەری ڕەعنا، لە داخی تانەی ئەغیاری
گوڵم ڕەحمێ بە حاڵم کە، دەبا دەرچم لە غەمباری
«تکا فرمێسکی خوێنینم لە جەور و دەردی زۆرداری
هەتا کەنگێ دەگەڵ کوشتەت ئەرێ دڵڕەق، ستەمکاری؟»

ئەمن ئاواتی ناکامم بە تەنیا وەسڵی یارم بوو
لە تاوی چاوەکەی مەستی بە دایم زاری کارم بوو
نیگار، بەسیە جەور، ژینم لە ڕێی تۆ دا بە تاڵان چوو
«لە بیرم ناچی تا مردن قەرار و عەهدی بابردوو
شکا جەستەم کە تۆ لات دا لە سوێندی بەرزی دڵداری»
خەزان وەرزی بە پڕتاو هات، پەلاماری لە باخم دا
وەکوو بوولەرزەیە تەکان لە ماڵ و کۆشک و کاخم دا
شکا نەشئەی مەلی هیوا و کەوی دەنگ خۆش لە شاخمدا
«دڵم پڕ بوو نەما جێی هیچ هومێدێکی لە ناخمدا
بە سەر یەکدا ڕژا ناسۆر و دەردی بێ پەرەستاری»
هەموو ناڵەی دڵە ئازیز ئەوەی ئەوڕۆ ئەمن لێی دوام
وەرە ناو باوەشی ئەشقم دەزانی چەندە بێئەنوام
کە من شەیدای جوانیتم لە شار و گوندەکەم ڕیسوام
«عەزیزم چاوی تۆ مەیخانەیە و مەیخۆری بێپەروام
وەرە ساقی کە سووتاوە دڵی تینووم نییە چاری»
بەرەو خاک و وڵاتم من چلۆن ڕێگا دەدەم دوژمن
دەبێ ون بێ لەبەر چاوا بچێتە بن پەنا و قوژبن
چلۆن ڕێیە دەدەم پێیان ئەگەر خوێنخۆر و خوێنمژ بن
«عەزیزان شاخ و داخی نیشتمانم قیبلەیە بۆ من
بە من چی ئاوی روکناباد و گوڵگەشت و بەر و باری»

دڵۆپێ خوێن لە ڕەگمانا نەما هێندی مژی حەزیا
نەیار زەردەی دەهات پێمان هەڤاڵیش بۆ هەڤاڵ گریا
بەڵام «ڕامیار» وەرێ‌کەوتبا لە گەڵ یارانی خۆی بریا
«عەلی! هەستە کە کاروان کەوتەڕێ تۆ مایەوە تەنیا
ئەگەر ڕێبواری ڕێی عیشقی، ئەگەر مەست و ئەوینداری»

# تاوانی بێ هێزی

تەخمیس لەسەر«تاوانی بێ هێزی» مامۆستا «هێمن »

دەپێوم ڕێ ئەگەر چی پڕ لە کۆسپ و مەینەت و کەندە
لە بۆ ڕزگاری هۆز و گەل کە جێگای من پەت و بەندە
لە سوێی هاوڕێی ئەویندارم دەناڵم چەشنی نەی، بەندە
«لە کۆ ئەسرین دەبارێنم لە بۆ کوردی پەڕاکەندە
لە گەرمێن غەرقی ئارەق بووم و چاوم هەر لە سامرەندە»

کە وێڵی شاخ و هەردم من بە وێنەی شەنگە شوانێکم
لە کوێ تینووی قومێ ئاو و نەماوی پاروە نانێکم
لە سەر ڕێبازی خۆم سوورم، بە هیوای چووکە ژوانێکم
«منی زنجیر پسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم
زەمانە گەرچی ئاڵۆز و پەشێوە، کەڵ بە موو بەندە»
بە ئاواتم گەییم، شوکرت دەکەم خوایە ئەوەی ئەمویست
کە من ڕێبواری ڕێی عیشقم گەلێ چێشتم خەمی پێویست
کەچی دڵبەر کە تووشی بووم بەگوێی خۆم هەرئەوەم لێ بیست
«گوتی ئێوارە بازاڕێ وەرە ماچت دەمێ، نەمویست
هەڵۆی کوێستانی کوردستانم و ناژیم بە دەستەندە»
لەژێر زەخت و گوشاری خەمە بە ناکامی ئەگەر ڕاکەم
دەبێ هەولێ بدەم ئالآی هومێد و تاسە بەرپا کەم
یەقین سوورم لە سەر عەهدی حەقیقی و موسەففاکەم
«دڵم سەد هێندی دیکانە بەناز بشکێنی دەنگ ناکەم
چ سودێکی هەیە ، کێیە بپرسێ داد و گازندە؟!»
ڕیاکار نیم بەڵام من هەر دەڵێم هەڵبەستی کوردانە
دەڵێم سوێند بەو برا شوانەی لە کێو و دەشت و هەردانە
وەکوو ئەو من دەژیم بێ ڕیا بە سەربەرزی و مەردانە
«جیهان و هەرچی خێر و خۆشییە بۆ هەڵبژاردانە
بە قانوونی تەبیعەت پاشەرۆکخۆرە ئەوی گەندە»

تکەی ئەسرینێ کۆ بۆوە هەتا پاڵی وە زەریا دا
دڵم هێند تەنگە پێم وایە لە ناخی قوڕگی حەزیادا
شەکەت بووم تازە دەرنابەم لە گۆشەی ژینی تەنیادا
«ئەگەر تاوانی بێ هێزی نییە بۆچی لە دونیادا
بەشی من ماتەم و شینە، بەشی خەڵکی زەماوەندە»
نەبوو کوردێکی وا زانا لە جیهانا ئە بەو جۆرە
ستێرێک بوو لە ئاسمانی ئەدەب یاران لە بۆ تۆرە[1]
لە ناو گۆڕیش بەڵێ سام و تەلەسمی بۆ ڕەقیب زۆرە
«بە مردوویش نیشانەی گوللەیە ئەو کەللە پڕ شۆرە
ئەوێستاش دەرسی سەربازی دەڵێ ئەو شاعیرە ڕەندە»
بە دووی ڕێبازەکەی وانا بەرەو ئاسۆی ئەوین دێم من
وتەی پیاوانی مێژوو هەر وەکوو ئاڵقە لە ناو گوێمن
ئەگەرچی کۆسپ و کەند و لەند دەزانم زۆر لە سەر ڕێمن
«سەری تەعزیم لە بەر تۆ دانەواندن فەخرە بۆ «هێمن»
بژی «حاجی» کە کێوی هیممەتت سەد هێندی ئەڵوەندە»

---

[1] – سێتر: ئەستێرە

# گیرۆدە

تەخمیس لە سەر «گیرۆدە»ی مامۆستا «هێدی»

گیری کردۆ دڵ بە داوی بسکەکەی تاتاتەوە
بۆیە تا مردن مەحاڵە تۆ لە بیران باتەوە
گەر دەڕاوێنم شەو و ڕۆژێ بە سەد ئاواتەوە
«کەی وتەی من وا بووە بێ یادی تۆ دەنگ داتەوە
کێ هەیە وەک تۆ بە خاڵێ، دەفتەرێ پڕکاتەوە»

گەرچی تیری خۆشەیستی ئاشقانی کوشتووە
خوێنی زۆر لاوی لە پێناو ئارەزوویا ڕشتووە
ئاوێزانی گەردنی تۆ هێندە جوان بوە ئەو مووە
«دڵ دەڵێی شێوەی وەفاداری لە زولفت فێر بووە
وا بە دڵسۆزی سەری هێناوەتە ژێر پاتەوە»
بێکەس و تەنیا ئەناڵم من لە گۆشە و قوژبنێ
چۆن لە ناو گێژاوی خەمدا تێوەچووم تا گەردنێ
سەیرە پیر و جوان و خاس و عام کە هانام بردنێ
«کەس نەبوو بۆ ئاوی دیدەی من سنوورێک دابنێ
تاکەی ئاخر هەر ئەمن بینووسم، ئەو بیشواتەوە»
شەربەت و هەتوانە بۆ وەی لێوبەبار بێ و دەردەدار
هێند زوڵاڵ و پاک و بێخەوشە بە ڕووتا دێتە خوار
پێی دەگەن لەو باخی ساوای سینەتا جووتێ هەنار
«هەر لە سایەی شەونمی گۆنات کە دەڕژێ جار و بار
خاڵی لێویشت لە ئاوی زمزمێ دەخواتەوە»
بولبولی تەبعم لە تاوی جوانی ڕووت و کولمی ئاڵ
بوو پەڕیوەی دەشتی تاسە کردیە زاری و ناڵەناڵ
پاکی پێوا کێو و دۆڵی نیشتمانی یاڵ بە یاڵ
«گەرچی مەیدانی بەترس و سامی زۆر دیوە خەیاڵ
ئەوڕۆ ئەو بێچارە خۆی بەندە بە یەک هەوداتەوە»

گەر لە حەسرەت تامی ژین یا ئەو ئەوینە بشمرم
غەیری وەسڵی تۆ عەزیزم نیمە ئاواتی ترم
پێک نەهات چبکەم هومێدی سەوز و جوان و دڵگرم
«چەندی کردم بەڵکوو تەسویری بزەی تۆ هەڵگرم
من بە دووی واژێکی شیرین دام کە خەو دەمباتەوە»
هەڵوەدای جیلوەی جوانی «زین»ی ئەشقم چەشنی «مەم»
یا وەکوو پەروانە باڵ سووتاوەکەی خولیایی شەم
دەستی بێ هەستی پەژارە ، بەر بدا بێتوو یەخەم
«دەردی سەرگەردانی دەڕوا دوایی هەر دێ دەرد و خەم
زۆری پێ ناچێ دەبینی «هێدی» ڕۆژی هاتەوە»

1382/1/13 هەتاوی

# خەیاڵ

شەمشەمەکوێرەی خەیاڵ
بێوچان
لە نێو مزڵی ڕەشی بەخت و
لە ئاسمانی تەمی ژینم
هەتا کەزیەی ڕەشی کچی شەو
بە هەناسەی تەڕی کوڕی بەیان
لا دەدرێ
بە دوای زەڕنەقووتەی وشەی شێعرا
وێڵە
بڵێی چەواشەی واژەی ئیلهام بێ خەیاڵ
یا عەوداڵ و گێژ
هەر فێری خێڵە

# دەمەو بەهاری

ڕەشبەڵەکە
دار و دەوەن، دەشت و زەوی
دۆڵ و چیا و ڕژد و نشێو
بەرز و نەوی
تەوێڵی دوندی گرژی کێو
لە شەرمی نیگای هەتاوی تاسە
دڵۆپ دڵۆپ
ئارەق دەکا

دەبن بە لێمشتە ئاوێ
بە سەر دڵی زەویدا پەخشان دەبن و
بووکی بەهار نارنج سپیش
بە رۆح و لەشی سڕەوە
بەرەو ئامێزی گەرمی کۆڕ
کۆڕی ڕازاوەی بەهاری
ڕێ دەکەوێ
چەپکێ گوڵی پێشکەش دەکا
بۆ دیاری ئەم ژینە نوێیە
ئەویش گوڵە گەزیزەیە

# بۆ قالەمەڕەی شمشاڵ ژەن

پەیمانت لەگەڵ کام لووتکەی چیا و
باڵات لە باڵای کێهە کیژۆڵە
بە خەیاڵی ئەشق گرێ داوە تۆ
ئەوەن دەردەدار
پەشێو و زامار
دڵ پڕ لە سۆز و کوڵ و
هەست و تاب
گشت کاتەکانی ژیان تاسەباری!
❄❄❄

خەیاڵی ژوانی کام شەنگەبێری
هانی دای لێوت بنێی
بە لێوی زەرد و بێگەرد و
بەتینی شمشاڵ؟
گڕی سەبوونی وشکەساڵی کام وەرزی هیواتە
باڵی خەیاڵ و بیرتی پڕووزاند
وا بە کەساسی دەناڵی بۆیان؟
❄❄❄
بێ‌گومان کسپەی ناسۆری خۆزیات
دڵی کۆمەڵی خەم دەلەرزێنێ
جەستەی نەیاری ماری زۆرداری
لە غوراِبی خەو
دادەهەژێنێ
❄❄❄
خۆزگە دەمزانی
گەردەلوولی خەم
بۆچ باڵای وەکوو باداک
لە باڵای
بیر و ئەندێشە و خەیاڵت هاڵاند.
❄❄❄
دا پێم بڵێ تۆ
لە ناخی باخی ئاخی هیواتا
گوڵووکی تاسەت

کێ پڕووکاندی؟
چی گەڵای سەوزی
بزەی لێوانی
وا بە ناکامی
لێ
هەڵوەراندی؟
❄❄❄
ژانی خەیاڵی مناڵی یادی
کام هەواڵت وا
دایگرتووی ئازیز
کە تۆ بە دەنگی مەلوول و خەمبار
لە ناو دڵ و گوێی عالەم بە ناڵە
وا گوێزەبانەی
بۆ دەکەی
«مامە»[1]
کە بۆتە کوانووی
مەینەت و ئاخ و
پەژارە
قورگی هەست و ئێحساست
مۆمی ئازار و ژان
تیا ئەگرێ

---

[1] - مەبەست مامە قادرە

پەڕپەڕۆکی باڵ تەسکی
خەیاڵت
لە دەوریان بۆیە
خول دەخوا و
دەفڕێ
❄❄❄
بەڵێن دەدەم پێت
رۆژێ
دێ رێژنەی
بارانی ئامانج
بڕژێنێتە سەر
ئەو هەمووە تینە
ببووژێتەوە پێی
ئەو ئاواتەی
ئاواتەخوازی روان و شینە
قاقای کوڕان و کیژی نیشتمان
ببنە زێڕووەشان
بۆ ئەو ئەوینە

13821220

نێوەرۆک:

ئەگەر شێعر دەڵێی، بۆ گەل دەڵێی، شێعری نەمر بڵێ
شێعری بەسۆز بڵێ، شێعری لەبار بڵێ، دڵگر بڵێ
ئەگەر زانیت شێعرت وەک بەهاری تەڕ و تازە نییە
دەس دە قەڵەم بۆ کوردستانی من شێعرێکی تر بڵێ

*هێدی*

خوێنەری بەڕێز! بۆ پێشەکی ئەم کتێبە دەمەوێ چەند وتە و تاریفی شاعیرانی پایەبەرزی کورد کە لەمەڕ شێعر بە گشتی و ئەدەبی کلاسیک بەتایبەت گوتراوە وەکوو دیارییەک پێشکەشتی بکەم.

ڕەنگە شێعری کلاسیک بەلای تاقمێک لە شاعیرانی لاوی نوێخوازەوە فەرتووت و کۆن بەئەژمار بێ. دوور نییە بەو هۆیە توکی لێ بکەن و بڵێن باوی نەماوە، لەمێژە گوتراوە و بیسراوە!

سەرەتا ئاماژە بە وەسفی شێعر دەکەم هەتا بزانن چییە و چۆناوچۆن یا لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ. کاک قاسم موئەییدزادە «هەڵۆ» لە وتووێژێکدا ئاوا باسی شێعر دەکا: شێعر پردێکە لە نێوان واقعیەت و حەقیقەتدا، لە نێوان فیزیک و. متافیزیکدا، لە نێوان ئەوەی هەیە و نییە، لە نێوان ئەوەی دەبێ ببێ و نەبووە.

شێعر پێکگەیشتنی مینهای بێنهایەتی زەمانە، دەگەڵ پێکگەیشتی بە ئیزافەی بێنهایەتی زەمان. یانی رابردووی دووری دوور دەگەڵ داهاتووی دووری دوور دەخاتە سەریەک.

دوو دێڕی شێعر وەک دوو سەری رووتی کارەبان، کە وێک دەکەون. کاتێک کە رابردوو و داهاتوو وێک دەکەون وەک ئەو دوو سەرە رووتەی سیم برووسکەیەک لێدەدەن، ئەوە ئیلهامی شێعریە.

لێرەدا من ناتوانم دانەدانەی ناوی شاعیرەکان بێنم بەڵام تاریف و وتە بەنرخەکانیان دەخەمە بەر چاوی خوێنەرە خۆشەویستەکان.

هەر لە ئەدیبان لە سەر ئەو رایەن شێعر یانی قسەکردن دەگەڵ جوانی و ئافرەت، هەموو هەستە دەروونییەکانیان، دەگەڵ سروشت.

شێعرێک تەواو مەبەست بپێکێ لە رووی زمانەوە، لە رووی تکنیکەوە، لە رووی ئەندێشەوە، لە رووی قووڵ بوونەوە بۆ ناخی ئینسان، ئەوە بەرهەمێکی جوانە.

شێعری جوان لە هەموو قۆناخێکدا هەر جوانە، وەکوو ئافرەتی کورد هەر بەرگێکی لەبەری کا هەر جوانە. پەری هەر پەرییە، کەوایە شێعر لە هەر قاڵبێکدا بێ هەر شێعرە، چ لە قاڵبی نوێدا، چ لە قاڵبی کۆنی عەرووزیدا.

خوالێخۆشبوو مامۆستا هێمن دەفەرمێ: «شێعر شوعار نییە، ئەورۆ بیڵێی و سبەینێ بمرێ. شێعر ئەوەیە هەر نەبێ بەینێک دوای شاعیرەکەی بمێنێتەوە.» باسی مامۆستا نالی دەکا کە غەزەلی عاشقانەی گوتووە. دەفەرمێ: «با ئەوەی کە مردووە تا ئەبەد لە دڵی مێژوو و ئەدەبدا زیندووە» لە جێگایەکی دیکەشدا دەڵێ: «شێعرێک بە ژانی خۆی لە دایک بێ، شێعرێک دەستی شاعیر بکێشێ بۆ لای قەڵەم ئەوە شێعری چاک دەبێ، نەک شاعیر بە زۆر لە خۆی نووسێ، هاتەران پاتەرانێک وەسەر یەک نێ و ناوی بنێتە شێعر. شێعرت نەیە و بە زۆر بینووسی وەک ئەوە وایە منالێک بە عەمەل لەدایک بێ. دیارە دوای بوونەکەشی هەر لاواز و کز و سست دەبێ.»

بەڵام بەڕێزان منیش لەسەر ئەو رایەم لە ئاسمانی خەیاڵاتدا هەوری هەست بگرمێنێ و بیر و ئەندێشە برووسکە بدەن. توخوا حەیف نییە ئیحساس، دنەت نەدات بۆ سەر هەست، دوایە دەست بکەی بە نووسینی شێعر. بە قەولی گوتوان شێعر هەر کاتێ هات دێ، ئیدی قالبی نوێ و چوار پارە و دووبەیتی و مەسنەوی و غەزەل و قەسیدە دەبێ خۆی شێعر هەڵیبژێرێ نەک شاعیر.

مامۆستا لەتیف هەڵمەت دەمی خۆش بێ و پەنجەی نەرزێ و قەڵەمی هەر وا پۆلایین بێ، بو تاریفی شێعر دەفەرمێ: «شێعر بەشێکە لە وجوودی شاعیر. هەر وەک دەست بەشێکە و چاو بەشێکە» هەر لەوبارەوە زۆری باس کردووە بەڵام پێم وایە هەر بەو تاریفە هەموو خوێنەرێک رازی دەبن و حاڵی دەبن لە نێوەرۆکی بابەتەکە.

شێعری کلاسیک بە درێژایی تەمەنی، پڕلایەنگرترین و بەسۆزترین قالبی شێعری بووە. ئەمڕۆکەش گەشی و زیندوویی خۆی لە زۆر بارانەوە پاراستووە.

ئێستا هەر لە شاعیرانی سەلەفی (بە قەولی نوێخوازەکان، دەنا ئێمە دەڵێن کلاسیکخواز) هەنگاویان بەرەو نوێ ناوە و مەزموونی نوێ لە قاڵبی غەزەلدا دەهۆننەوە. زۆریش سەرکەوتوون. لەو بوارەدا لە شاعیرانی فارسدا بۆ وێنە سیمین بێهبەهانی، لە کورداندا کاک ئەمین گەردیگلانی. شێعری هەر کام لەو شاعیرانە قەت پیر نابن و هەر بە چل ساڵ بارێکن.

ئەوجار با جڵەوی ئەسپی بەیان وەرگێرم بۆ سەر شێعرەکانی خۆم. ئەوانەی کە لەم کتێبەدا چاپ بوون.

خوێنەری هێژا! هەر کە چاوت پێیان بکەوێ بەر لە هەموو شتێک رەنگە رەخنەی ئاشقانەیان لێبگری. بەڵام چبکەم، لە تەمەنی جوانیدا نەفس حوکمی بەسەر دڵ و هەستدا رەوانەو ئەوین و خۆشەویستی لە ناخ و ئەندێشەی خەیاڵدا دەرسکێ. هەر چەند من خۆم بە شاعیر نازانم بەڵکوو شێعردۆستم، شاعیر پەرەست، شاعیرانیش کەمێک دڵتەڕ و جوان پەرەستن.

لە روانگەی منیشەوە جوانی تا رادەیەک پڕبایەخە و نرخی ئەو ئەوینە رۆحی دەیان ئاشقی وەیلانە. لە لایەکی تریشەوە لە سەر ترۆپکی غەزەل ئاوری ئەشق دایسێ. وەک دەڵێن دەمار و پنجی غەزەل بە شەونمی گۆنای کچی نازداری لەبار ئاو دەدرێ.

هەستیاری بەڕێز! بۆ ئەو بەشە لە شێعرەکانم سەردێڕی «کانیاوی غەزەل»م هەڵبژاردووە. بە هۆیە کە ناونیشانی پارچە هەڵبەستێکمە کە لە سەر دووبەیتییەکی مامۆستا «هێدی» نووسیومە. هەوەڵ شێعرمە کە لە قاڵبی غەزەلدا نووسیومە. دووهەم بەو هۆیە زۆربەی زۆری ئەو شێعرانەی کتێبەکە غەزەلن.

بە هیوای ژینێکی بێدەرد و بەڵا، نانێکی بێ بۆڵە و هەڵا بۆ هەموو لایەکی.

براتان: مستەفا پۆڵادەرک «رامیار» ـ شێخاڵی

سەرچاوە: کۆڤاری وتووێژی شاعیرانی کورد. ژمارە1، ورمێ
گوڵبژێری غەزەلی شاعیرانی کورد (3)